زنجیرە وەرگێڕانی گروپی ئەثەر: ١



# إِجمَاعُ المُسلِمينَ على أَنَّ اللّٰهَ تَعالى في السَّماءِ على عَرشِهِ

## کۆدەنگی موسڵمانان دەربارەی ئەوەی الله تعالی لە ئاسمانە لەسەر عەرشەکەی

کۆکردنەوەی

**محمد بن شمس الدين**

وەرگێڕانی گروپی






# إجماع المسلمين

# على أن الله (سبحانه وتعالى)

# في السماء على عرشه

## کۆدەنگی موسڵمانان دەربارەی ئەوەی الله (سبحانه وتعالى) لە ئاسمانە لەسەر عەرشەکەی


کۆکردنەوەی:

محمد بن شمس الدين

وەرگێڕانی:

گروپی ئەثەر



١٤٤٤ی کۆچیی

# مُقَدِّمَة

بسم الله الرحمن الرحيم، الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين، نبينا محمد (ﷺ) وعلى آله وصحبه أجمعين.

اللهم أرنا الحق حقا وارزقنا اتباعه، وإرنا الباطل باطلا وارزقنا اجتنابه، أما بعد:

موسڵمانی بەڕێز و سەنگین، ئەم نامیلکەیەی بەردەستت کە ناوی ((إجماع المسلمين على أن اللَّهُ (ﷻ) في السماء على عرشه) (کۆدەنگی موسڵمانان دەربارەی ئەوەی اللَّهُ (ﷻ) لە ئاسمانە لەسەر عەرشەکەی))، کە ئەمەش کۆدەنگی هاوەڵان و سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، وە بیروباوەڕی موسڵمانانە دەربارەی پەروەردگاری خۆیان، بەپێچەوانەی ئەهلی کوفر و گومڕایی لە جەهمییەکان و هاوشێوەکانیان، پەروەردگار کاری بۆ ئاسانکردین و توانیمان وەریگێڕین بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، بە مەبەستی ئاشناکردنی موسڵمانان بە بابەتێکی هەستیاری دینەکەیان، پەروەردگار پاداشتی خێری شێخی بەڕێزمان شێخ محمد بداتەوە بۆ کۆکردنەوەی ئەم ئایەت و فەرموودە و ئەثەرانە، پاشان شێخمان خۆشحاڵ بوو بەوەی پێمان وت نامیلکەکەی وەرەگێڕین بۆ زمانی کوردی، داواکارین لە اللَّهُ (ﷻ) ئەم کارەمان لێ قەبووڵ بفەرموێت و بیخاتە تای تەرازووی چاکەکانمان و بەهۆیەوە ڕزگارمان بکات لەو ڕۆژەی کە منداڵ پیر ئەکات لەبەر سەختییەکەی، بەڕاستی پەروەردگارمان زۆر بەڕەحمە..

وصلى الله وسلم وبارک على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

گرووپی ئەثەر

٢٣ / جماد الآخرة / ١٤٤٤ی کۆچیی

قەزای کەلار / پارێزگای سلێمانی / هەرێمی کوردستانی عێراق

## پێشەکی نوسەر:

بسم الله والحمد والصلاة والسلام على رسول الله (ﷺ)، پەروەردگار هاوکاریم بکە و کارم بۆ ئاسان بکە ئەی پەروەرگاری کریم، وە پاشان:

هەموو ئوممەت هاوڕان بەبێ ڕا جیاوازیی کە ﷲ (ﷻ) -وەکو چۆن خۆی پێ ناساندوین- لە ئاسمانە لەسەروو عەرشەوە، تاکوو جەهمییەکان دەرکەوتن، دوای ئەوە کۆمەڵێک لە موعتەزیلە بەدوایانکەوتن، وە وتیان کە: (ﷲ لە هەموو شوێنێکە)، وە هیشام فوطی موعتەزیلی وتی: (کە ﷲ لە شوێندا نییە)، وە ئەوانە هەمیشە ڕەتکراوە و شاذن لە ئومەتی موحەممەد (ﷺ)، ئەهلی سوننە وەڵامیان ئەدەنەوە، خەڵکی عەوام ڕقیان لێیانە، تاکوو ئەشعەرییەت و ماتوریدییەت هاتن لە سەدەی چوارەمی کۆچیی بۆ زیندوکردنەوە و لەخۆگرتنی مەزهەبی فوطی، وە بڵاوکردنەوەی لە نێو خەڵکیدا، لە ژێر سەرپۆشێکی تەقیەدا[1]، هەروەک چۆن إبن قودامەی مەقدسی ئەڵێ: (لە ئەهلی بیدەعدا کۆمەڵێک ناناسین کە ڕاکانی خۆیان بشارنەوە و بوێری دەرخستنیان نەبێت بێجگە لە زندیق و ئەشعەریەکان).

بۆیە کاتێک خۆیان پاڵدایە سوڵتانەکان، و خۆشەویستی ئەوانیان بە دەست هێنا، وە پلەو پۆستی دادگا و فتوادانیان وەرگرت ، بیروباوەڕی خۆیانیان ئاشکرا کرد و بڵاویان کردەوە لە نێو خەڵکیدا، ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ وَأَنَّ اللَّهَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾[2]، واتە: (ئایا نەیان زانیوە کە بێگومان ﷲ ئاگادارە بە نهێنی و چپەیان، بەڕاستی ﷲ ئەوپەڕی ڕادە بە ئاگا و زانایە بە شاراوە و پەنهانەکان).

وە ئەگەر ئایەتەکانی قورئانیان بۆ بهێنیتەوە، واتاکانیان تێکدا، وە کاتێک فەرموودەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) بۆ دێنیتەوە، ڕەتیان کردەوە بە بیانووی ئەوەی کە ئاحادە[3]، یاخود هەوڵ ئەدەن تەضعیفی بکەن (بە لاوازی دابنێن)، یاخود واتاکانی

(١) تەقییە واتە: شاردنەوەی بیروباوەڕ.
(٢) التوبة : ٧٨.
(٣) فەرموودەی ئاحاد:
١) پێناسەکەی لە ڕووی زاراوەوە: ئەو فەرموودەیە کە مەرجەکانی موتەواتیری تێدا نەهاتبێتە جێ.

تێک بدەن، وە ئەگەر وتەکانی هاوەڵان و ئەهلی عیلمیان بۆ بهێنیتەوە، هەمان ئەو شتانە ئەکەن کە بەرامبەر بە دەقی دوو وەحییەکە کردویانە (واتە قورئان و فەرموودە)، یاخود ئەو زانایە تۆمەتبار ئەکەن بە تەجسیم[٤] و کوفر، وە ئەگەر پێیان بڵێی: ﴿هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا﴾[٥]، واتە: (ئایا هیچ زانیاریەکتان لایە، تا ئاشکرای بکەن بۆمان و دەری ببرن)، هیچیان لا نادۆزیتەوە جگە لە غەڵبە غەڵبی فەیلەسووفەکان نەبێت، وە وشەکاری کاهینەکان وەکو وتەکەیان کە ئەڵێ: (الذي أين الأين لا أين له)، واتە: (ئەوەی کاتی دروست کردووە، ناکرێ ئامرازەکانی کاتی بەسەردا جێبەجێ ببێ).

هەروەها ئەڵێن (ئەو هەبوو و هیچ شوێنێک نەبوو، ئەو شوێنی دروست کرد، وە ئەو هەر لەسەر ئەوەیە کە هەبوو)، وە ئا لەوانەدا ئەو وتەی زانای شارەزایان تێدا ئەبینیت (مەبەستی ٱللَّهُ (ﷻ)یە): ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ۞ قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ ۖ فَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ﴾[٦]، واتە: (ئێوە شوێنی هیچ شتێکی تر ناکەون جگە لە گومان و ئێوە هیچ شتێکی تر ناکەن مەگەر ئەوە نەبێت کە درۆ ئەکەن ۞ پێیان بڵێ: کەوابوو هەر بۆ ٱللَّهُ (ﷻ)یە بەڵگە تێر و تەواوەکان، جا ئەگەر بیویستایە ئەوە هەمووتانی بە تەواوی هیدایەت ئەدا و بە ناچاریی هەمووان بڕوادار دەبوون).

---

(٢) حوکمەکەی: سوودی زانستی تیۆری هەیە (العلم النظري)، واتە: ئەو زانستەیە کە لەسەر تێڕوانین و بەڵگەدارکردن وەستاوە، واتە پێویستە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ کە ئایا صەحیحە یان نا.

(٣) بەشەکانی فەرموودەی ئاحاد بە گوێرەی ژمارەی ڕێگاکانی:

أ) مشهور (بەناوبانگ).

ب) عزيز (دەگمەن).

ت) غريب (نامۆ).

ئەهلی بیدەع ئەم جۆرانە ڕەت ئەکەنەوە لە بواری بیروباوەڕدا، بە بیانوی نەبوونی یەقین دەربارەی فەرموودەکە، بە پێچەوانەوە ئەهلی سوونەت و جەماعەت گەر بۆیان دەربکەوێت کە فەرموودەکە صیحیحە ئەوە کاری پێدەکەن، جا با غەریبیش بێت، والله أعلم بالصواب.

(٤) تەجسیم واتە جیسم بۆدانان، مەبەستی ئەوەیە کە ئەهلی بیدەع ئەو کەسانە تۆمەتبار ئەکەن بەوەی کە گوایە ئەمان لەوانەن کەوا جیسم بۆ ٱللَّهُ (ﷻ) دادەنێن، کە ئەمە درۆیەکی ئاشکرایە و ئەهلی سوننەت و جەماعەتبەریین لە بیروباوەڕیی کوفریی جیسم دانان بۆ ٱللَّهُ (ﷻ)، پاکی و بێگەردیی بۆ ئەو زاتە بڵندە، والله أعلم بالصواب.

(٥) الأنعام : ١٤٨.

(٦) الأنعام ؛ ١٤٨ و ١٤٩.

ئەگەر پێیان بڵێی: ﴿قُلْ هَلُمَّ شُهَدَاءَكُمُ الَّذِينَ يَشْهَدُونَ﴾[٧]، واتە: (پێیان بڵێ: ئادەی ئەو شایەتانەتان بهێنن کە شایەتی دەدەن)، کە ﷲ ئەو شتەی فەرمووە دەربارەی زاتی خۆی کە ئێوە دەیڵێن، یاخود پێغەمبەرەکەی (ﷺ) وای دەربارە فەرموو بێت، یاخود هاوەڵانی پێغەمبەرەکەی دەربارەی وایان وتبێت، ناتوانن هیچت بۆ بهێنن جگە لە چەند دەقێکی گشتی، کە ئێمە لەوان زیاتر لێوەی نزیکین، یاخود بە حەفەرموودەیەکەوە دێن کە شێخەیەکەیان عبدالقاهری بەغدادی بەناوی علی کوڕی ئەبی طالیب (ﷺ) دروستی کردووە، وە وازیان لە قورئان و سونەت و وتەی هاوەڵان و ئیجماع هێناوە، شوێنی ئەوە کەوتن کە شەیطانەکان دەیخوێندنەوە بەسەریاندا لە کتێبەکانی یۆنانیە کۆنەکان، بۆ ئەوەی ڕەددی وتەکانی ﷲ (ﷻ) بدەنەوە بەوپەڕی بوێرییەوە، سەرنجبدە شێخەکەیان الآمدي کە کتێبەکەی پڕکردووە لە (طلاسم)ی شەیطان کە لە فەیلەسووفەکانەوە وەریگرتووە، ئەڵێ: (لەوانەیە بەرامبەر لێرەدا دەست بگرێت بە ڕووکەشی قورئان و سوننەت و وتەی هەندێک لە ئیمامەکان، وە هەموو ئەمانە بەڵگەی گوماناوین و ناکرێت بەکاربهێندرێن لە بابەتە یەکلایی کراوەکان، هەر بۆیە وامان هەڵبژارد کە پشتی تێ بکەین و کات بە هێنانەوەی ئەو بەڵگانە بەفیڕۆ نەدەین، لە کاتێکدا ئەیبینی لە بابەتە دینییەکان و ناسینی ﷲ (ﷻ)دا، قسەکانی ئەرسطۆ دەکاتە پاڵپشت و ئەیهێنێتەوە، سەرنج بدە کە چۆن سەرشۆڕیی ڕوو دەکاتە دینی ئەهلی گومڕایی،

ئەوان لە کوێن کە ﷲ (ﷻ) دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ ۗ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾[٨]، واتە: (ئایا ئەوانە لە ڕێگەی تەوراتەوە پەیمانیان لێ وەرنەگیراوە کە بە ناوی پەروەردگارەوە شتێک نەڵێن جگە لە حەق و ڕاستی؟ خۆ هەرچی لە تەوراتدا هەیە، ئەوانە خوێندویانە و دەیزانن!، بێگومان ماڵی قیامەت، بەهەشتی بەرین، چاکترە بۆ ئەوانەی کە خواناسی و دینداری دەکەنە کاڵای باڵایان، باشە ئەوە تاکەی ژیرنابن؟!).

پەروەردگار ڕاستی فەرمووە: ﴿وَمَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ ۖ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا ۞ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ۞ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ الْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ

(٧) الأنعام : ١٥٠.
(٨) الأعراف : ١٦٩.

هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اهْتَدَىٰ)[٩]، واته: (ئەوانە لەوبارەیەوە هیچ جۆرە زانست و زانیارییەکیان نییە، بەڵکو هەر شوێنی گومانی بێ سەر و بن دەکەون، لە کاتێکدا کە گومان بە هیچ شێوەیەک جێی حەق و ڕاستی ناگرێتەوە ﴿ گوێ مەدە بەو کەسەی کە یاخی بووە لە یاد و بەرنامەی ئێمە، مەبەستیشی نەبووە تەنها ژیانی ئەم دنیایە نەبێت ﴿ هەر ئەوەندەی لێ دەزانن و عەقڵیان هەر ئەوەندە دەبڕێت، بەڕاستی هەر پەروەردگاری تۆیە کە چاک دەزانێت کێ لە ڕێبازەکەی لایداوە و گومڕایە، وە کێیش ڕێبازی ئیمان و هیدایەتی گرتۆتە بەر و شایستەی ڕێزە).

وە لەبەر ئەوە، لەم چەند لاپەڕە کەمەدا ئەوەی کۆدەنگی ئەهلی عیلمم گواستووەتەوە، باس ئەکەم، دوای باسکردنی ئایەتەکانی قورئان کە بەڵگەن لەسەر بابەتەکە، وە وتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە هەندێ لە هاوەڵە بەڕێزەکان، وە خانەوادە پاککراوەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە من ئەو فەرموودە و ئەثارانە باس ئەکەم کە صەحیح و ڕوون و ئاشکران، گەرنا بێتوو بگەڕێیتەوە بۆ پەرتووکەکانی سوننە و موسنەدەکان زۆرێک ئەدۆزیتەوە لەوەی کە دامناوە، بەڵام ئامانجی کتێبەکەم: (کۆدەنگییە)، بۆیە کورتم کردەوە، وە هەرکەسێک زیاتری دەوێت با کتێبی [العلو]ی ذەهەبی بخوێنێتەوە، لەوێدا زۆر باش و چاک نوسیویەتی.

(٩) النجم : ٢٨ تا ٣٠.

## یەکەم: ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز

لێرە ئاگاداری دەدەم کە من بە تەواوی سیاقم گواستۆتەوە، وە ئامانجم هەیە لەمەدا، کە ئەو کەسەی تەدەبور بکات و بیر لە سیاقەکە بکاتەوە ئەبینێ لە پێش و پاشییەوە جەختکراوتەوە لە واتەکەی، سەرفرازیی بۆ ئەو کەسەی تەدەبور دەکات و بیری لێ دەکاتەوە.

١) (إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ)(١٠)، واتە: (بێگومان پەروەردگارتان ﷲ (ﷻ)یە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوییە لە ماوەی شەش ڕۆژدا، پاشان بەرزبوویەوە بۆ سەر عەرشەکەی، بەشەو، ڕۆژ دادەپۆشێت، لە کاتێکدا بە شێنەیی عەودالّە بەدوایدا، خۆر و مانگ و ئەستێرەکان هەموویان بە فەرمانی ﷲ کەوتوونەتە گەڕ و لە فەرمانی دەرناچن، ئاگاداربن و بزانن و تێفکرن کە هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە، موبارەک و پیرۆز و گەورەیە زاتی ﷲ (ﷻ)ی پەروەردگاری جیهانیان).

٢) إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِن بَعْدِ إِذْنِهِ ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ)(١١)، واتە: (بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە ئەو زاتەیە کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە لە شەش ڕۆژدا، پاشان بەرزبوویەوە بۆ سەر عەرش و قەراری گرت (باوەڕمان پێیەتی، بەلاّم چۆنیەتیێکەی نازانین)، ﷲ هەموو کاروبارەکان هەڵدەسوڕێنێت، هیچ تکاکارێک نییە (بۆ کەس)، مەگەر لەپاش ڕێگەدانی ئەو نەبێت، ئەو زاتە پەروەردگاری ئێوەیە کەواتە هەر ئەو بپەرستن، دەی ئایا ئێوە بیرناکەنەوە؟).

---

(١٠) الأعراف : ٥٤.

(١١) يونس : ٣.

٣) المر ۚ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ ۗ وَالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ۞ اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ)[١٢]، واته: ((ئەلیف، لام، ڕا) ئەمانە ئایەتەکانی پەرتووکی ئاسمانین، وە ئەوەی نێرراوەتە خوارەوە بۆ تۆ لە لایەن پەروەردگارتەوە هەق و ڕاستە بەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن ۞ ئەو خوایەی ئاسمانەکانی بەرزکردۆتەوە بێ هیچ پایە و ستونێک، وەک دەیبینن، پاشان بەرز بووەوە بۆ سەر عەرش و قەراری گرت وە خۆر و مانگی ڕام هێناوە (بۆ خزمەتکردنی خەڵکی)، هەر یەکەیان دەگەڕێت تا کاتی دیاریکراو، هەموو کاروبارێک هەڵدەسوڕێنێ و ئایەتەکان ڕوون دەکاتەوە (بۆتان)، هەتا لە (زیندوو بوونەوە و) گەیشتن بە خزمەت پەروەردگارتان دڵنیابن).

٤) (طه ۞ مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ ۞ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ۞ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى ۞ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ)[١٣]، واته: (طا، ها ۞ قورئانمان نە ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ بۆ ئەوەی دوو چاری ناڕەحەتی غەم و پەژارە ببیت ۞ تەنها ئامۆژگاری و بیر خستنەوەیە بۆ ئەو کەسەی (لە ﷲ) دەترسێت ۞ (ئەم قورئانە) بە بەش بەش نێردراوەتە خوارەوە، لە لایەن زاتێکەوە کە زەوی و ئاسمانە بەرز و بڵندەکانی دروستکردووە ۞ کە پەروەردگاری میهرەبانە بەرزبووەوە بۆ سەر عەرش و قەراری گرت).

٥) (وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ ۚ وَكَفَىٰ بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا ۞ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۚ الرَّحْمَٰنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا ۞ وَإِذَا

---

(١٢) الرعد : ١ و ٢.
(١٣) طه : ١ تا ٥.

قِيلَ لَهُمُ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَنِ قَالُوا وَمَا الرَّحْمَنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا۩)[١٤]، واته: (پشت ببەستە بە پەروەردگاری زیندوو، کە زاتێکە هەرگیز نامرێت، تەسبیحات بکە بە ستایشی ئەو، بەسە بۆ تۆ کە ﷻ ئاگادارە بە گوناهی بەندەکانی ❁ ئەو پەروەردگارەی کە ئاسمانەکان و زەویی دروستکردووە وە ئەوەیشی لە نێوانیاندایە لە شەش ڕۆژدا، لە پاشانیش بەرزبوویەوە بۆ سەر عەرش و قەراری گرت، ئەو پەروەردگاری میهرەبانە، کەواتە پرسیار لە زاتێک بکە کە بە هەموو شت زانا و ئاگادارە ❁ وە کاتێک بەوان بوترێت سوژدە ببەن بۆ پەروەردگاری میهرەبان، ئەڵێن: (ڕەحمان کێیە؟ (ئێمە نایناسین) ئایا سوژدە ببەین بۆ ئەو زاتەی کە تۆ فەرمانمان پێ ئەدەیت؟)، وە (بەم داوای سوژدە بردنە) دورکەوتنەوەیان زیاتر دەبێت).

٦) (الم ❁ تَنزِيلُ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ❁ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ۚ بَلْ هُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّا أَتَاهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ❁ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ ۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ❁ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ❁ ذَٰلِكَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ)[١٥]، واتە: ((ئەلیف، لام، میم) ❁ هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانە هیچ گومانی تێدا نییە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوەیە ❁ ئایا (کافرەکان) ئەڵێن: موحەممەد (ﷺ) خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە (نەخێر هەڵی نەبەستووە)، بەڵکوو ئەو (قورئانە) ڕاستە لە لایەن پەروەردگارتەوە (هاتووە) بۆ ئەوەی بەو (قورئانە) خەڵکێک بترسێنیت کە لە پێش تۆ هیچ ترسێنەرێکیان بۆ نەهاتووە، بەڵکوو ڕێنمونی وەرگرن ❁ ﷻ زاتێکە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە بەدیهێناوە لە شەش ڕۆژدا، پاشان بەرزبوویەوە بۆ سەر عەرش و قەراری گرت، جگە لەو پەروەدگارە هیچ پشتیوان و تکاکارێکتان نییە، دەی بۆ بیرناکەنەوە و پەند وەرناگرن ❁ پەروەردگار هەموو کاروبارەکان بەڕێوە ئەبات، لە ئاسمانەوە

(١٤) الفرقان : ٥٨ تا ٦٠.
(١٥) السجدة : ١ تا ٦.

تا زەوی (تاکوو ڕۆژی دوای)، لە پاشان هەموو ئەو کاروبارە بەرز دەبێتەوە بۆ لای خۆی لە ڕۆژێکدا (لە قیامەتدا) کە ئەندازەکەی هەزار ساڵە لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن ۞ ئەو پەروەردگارە زانایە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەک، بە دەسەڵات و میهرەبانە).

٧) (هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ)(١٦)، واتە: (ٱللَّه ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە لە شەش ڕۆژدا پاشان بەرزبوویەوە بۆ سەر عەرش (باوەڕمان پێ یەتی بەو شێوەی شیاوی خوا بێ)، دەزانێت چی دەچێتە ناو زەوی وە چی لێ دێتە دەرەوە، وە چی لە ئاسمانەوە دێتە خوار، وە چی بۆ سەردەکەوێ وە لە هەر کوێ بن، ٱللَّه لە گەڵتانە وە ٱللَّه بینایە بە هەر شتێک کە ئەیکەن).

٨) (مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ)(١٧)، واتە: (هەرکەسێک گەورەیی و سەربەرزی ئەوێ، لە ٱللَّه بوێ، چونکە بەڕاستی هەموو گەورەیی و دەسەڵات هەر بۆ ٱللَّه (ﷻ)یە وتەی پاک و چاک تەنها بۆ لای ئەو سەرئەکەوێ، وە (وتەی پاک) کردەوەی چاک بەرزی ئەکاتەوە، وە ئەوانەی کە پیلانە خراپەکان ئەگێڕن، سزایەکی توند و بەتینیان بۆ هەیە و فێڵ و پیلانی ئەوانە لەناو دەچێ).

٩) (وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ وَالْمَلَائِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۞ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ)(١٨)، واتە: (ئایا ئەوانە سەرنج نادەن و نابینن کە هەرچی ٱللَّه (ﷻ) دروستی کردووە، سێبەرەکانیان ئەگۆڕێت بە لای ڕاست

(١٦) الحديد : ٤.
(١٧) فاطر : ١٠.
(١٨) النحل : ٤٩ و ٥٠.

و چەپیاندا، بە ملکەچییەوە سەجدە بۆ ﷲ ئەبەن ۞ هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، هەموو سەجدە بۆ ﷲ (ﷻ) ئەبەن لە گیانلەبەران و فریشتەکان لە هەمان کاتدا خۆسیان بە گەورە دانانێن).

١٠) (إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ)[١٩]، واتە: (بیهێنەرەوە یادت کاتێ ﷲ (ﷻ) فەرمووی ئەی عیسا من تۆ ئەمرێنم و گیانت بەرز ئەکەمەوە بۆ لای خۆم).

١١) (وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ۞ بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ)[٢٠]، واتە: (وە بە هۆی ئەوەی کە وتیان بێگومان ئێمە مەسیح عیسای کوڕی مەریەممان کوشت کە پێغەمبەری خوای (ﷺ)، لە کاتێکدا نەشیان کوشتبوو، وە هەڵیسیان نەواسیبوو، بەڵکوو لێیان گۆڕدرا وە بێگومان ئەوانەی دووبەرەکییان تێ کەوت دەربارەی عیسا لە گوماندان لە کوشتنەکەیدا هیچ زانینێکیان دەرباری نییە، جگە لە شوێن کەوتنی گومان نەبێت، وە بەڕاستی و بێگومان نەیان کوشتبوو ۞ وا نیە، بەڵکوو ﷲ (ﷻ) بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، وە ﷲ (ﷻ) هەمیشە زاڵە و کار دروستە).

١٢) (بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ۚ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ۞ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ۞ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ۞ أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِّنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ۞ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ)[٢١]، واتە: (واز لەوە بهێنە بەڵکوو حەق ئەدەین بەسەر بەتاڵ و ناحەقدام بە هۆیەوە بەتاڵ مێشکی دەپژێ و

(١٩) آل عمران : ٥٥.
(٢٠) النساء : ١٥٧ و ١٥٨.
(٢١) الأنبياء : ١٨ بۆ ٢٢.

تێکدەشکێ، ئینجا دەست بەجێ بەتاڵ دەفەوتێ و لەناودەچێ، هاواز و سزای بەتین بۆ ئێوە لەبەرەوەی ئەیلێین و ڕەواو ئەدەن بۆ ﷲ (ﷻ) ❁ تەنها بۆ ﷲ یە (ﷻ) ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایەم وە ئەو فریشتانەی لای ﷲ (ﷻ) هەرگیز خۆیان بە زل نازانن و هەرگیزیش ماندوو نابن ❁ شەو و ڕۆژ تەسبیحات و ستایشی ﷲ (ﷻ) ئەکەن و ماندوو نابن ❁ ئایا ئەوانە هەڵیان بژاردووە و بڕیاریان داوە چەند پەرسترا و خوایەک (لە جگە ﷲ (ﷻ)) لە زەویدا بۆ خۆیان؟ کە ئەوانە مردوو زیندوو ئەکەنەوە! ❁ ئەگەر لە هەردووکیاندا (واتە: ئاسمان و زەوی) چەند پەرستراوێک هەبوایە جگە لە ﷲ (ﷻ) بێگومان ئاسمان و زەوی هەردوو کاول ئەبوون، دەی پاک و بێگەردەی بۆ ﷲی خاوەن عەرش لەوەی کافران ئەنجامی ئەدەن لە شیرک و کوفر).

١٣) (وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ ۚ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ ❁ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ ۚ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَىٰ ۚ قُل لَّا أَشْهَدُ ۚ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ)[٢٢]، واتە: (وە هەر زاڵ و ئەوە دەست ڕۆیشتوو بەسەر بەندەکانیدا، هەر ئەویش کار دروستیی ئاگادارە ❁ ئەو موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: شایەتیدانی کێ لە شایەتیدانێک گەورەترە لەسەر پێغەمبەرێتی من، بڵێ ﷲ (ﷻ) گەورەترین شایەتە لە نێوان من و ئێوەدا، وە ئەم قورئانە دابەزێنراوە و سروش کراوە بۆ من بۆ ئەوەی ئێوە پێ بترسێنم و هەرکەسێکی تریش کە پێی ئەگات، ئایا بەڕاستی ئێوە شایەتی ئەدەن کە بە دڵنیاییەوە لەگەڵ ﷲ (ﷻ)دا پەرستراوێکی تر هەبێ کە شایەنی پەرستن بێ؟!، بڵێ: من شایەتی ئاوا نارەوا نادەم، بڵێ: بێگومان هەر ئەو پەرستراوی تاک و تەنهایە وە بەڕاستی من بەریم لەوەی کە ئێوە ئەیکەن بە هاوەڵ بۆ ﷲ (ﷻ)).

(٢٢) الأنعام: ١٨ و ١٩.

١٤) (هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ ۖ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ ﴿﴾ أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ ﴿﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ ۚ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَٰنُ ۚ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ ﴿﴾ أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ الرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ)[٢٣]، واته: (الله (ﷻ) ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ ڕام کردوون، دەی بگەڕێن بە قەراغ و لاشانیا، وە لە ڕۆزیی الله (ﷻ) بخۆن، وە هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوە ﴿﴾ ئایا دڵنیان لەو اللهەی کە لە ئاسمانەکە، کە بتانباتە خوارەوە بە ناخی زەویدا لە کاتێکدا کە زەوی وەک دەریا گێژ بخوات بێتە لەرزی؟ ﴿﴾ ئایا دڵنیان لەو اللهەی کە لە ئاسمانە کە بای توندتان بنێرێتە سەر بە وردی زیخەوە ئەو کاتە تێ ئەگەن کە هەڕەشەی ئێمە چۆنە؟ ﴿﴾ ئایا سەیری باڵندەکان ناکەن بە ژوور سەریانەوە بە باڵ کراوەیی و هێنانەوەیەک ڕای نەگرتوون بەو ئاسمانەوە الله نەبێ کە بە هەموو شتێک بینایە ﴿﴾ ئایا ئەوە کێیە ئەو کەسەی کە لەشکری ئێوەیە و یارمەتییتان ئەدات لە جیاتی اللهی پەروەردگاری میهرەبان؟! کافران هەر لە فریوخواردندان).

١٥) (وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَن جَاءَ بِالْهُدَىٰ مِنْ عِندِهِ وَمَن تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ ۖ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ ﴿﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿﴾ وَاسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ﴿﴾ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ ۖ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ ﴿﴾ وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنصَرُونَ)[٢٤]، واته: (موسا وتی پەروەردگارم زاناترە بەو کەسەی کە ڕێنموونی لای ئەوەوە هێناوە، وە زاناترە بەو کەسەی سەرەنجام و دوا ڕۆژی چاکی دەبێت،

---

(٢٣) الملک : ١٥ بۆ ٢٠.

(٢٤) القصص : ٣٧ بۆ ٤١.

بەڕاستی ئەو پەروەردگارە ستەمکاران ڕزگار ناکات ۞ فیرعەون وتی ئەی گەورە و بەڕێزەکان، وا نازانم جگە لە خۆم هیچ پەرستراوێکی ترتان هەبێت، جا بۆ زیاتر دڵنیا بوون ئەی هامان کورەی ئاگر تاودە و خشتی سورەوە کراوای لێ دروست بکە بۆم، ئینجا لە خشتە کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە، بە گاڵتەوە وتی بەڵکو سەیری خواکەی موسا بکەم و ببینین و بەڕاستی وائەزانم ئەو موسایە لە درۆزنانە ۞ فیرعەون و لەشکر و سەربازەکانی خۆیان بە زل زانی لە وڵات و زەوی میصردا بە ناڕەوا، وە وا گومانیان برد کە زیندوو ناکرێنەوە و ناگەڕێنرێنەوە بۆ لای ئێمە ۞ جا تۆڵەمان لە فیرعەون و لەشکر و سەربازەکانی سەند و فڕێمان دانە ناو ئاوی نیلەوە، ئینجا سەرنج بدا ئەی موحەممەد (ﷺ) سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو ۞ ئەوانمان کردە پێشەوایانێک کە خەڵک بانگ ئەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ و لە ڕۆژی قیامەتیشدا یارمەتی نادرێن ۞ لەم دونیایەدا نەفرین و لەعنەتی خۆمانمان نارد بە دوایاندا و بۆیان، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئەوانە لە بێزراو و دورخراوانن لە ڕەحمەتی ئێمە).

١٦) (الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ۞ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ ۞ أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِبًا ۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ ۞ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ)[٢٥]، واتە: (ئەوانەی دەربارەی نیشانەکانی ﷲ (ﷻ) دەمەقاڵێ ئەکەن بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێت، ئەو دەمەقاڵێیەیان هۆی تووڕەیی لای پەروەردگار، وە لای ئەوانەش باوەڕیان هێناوە، ئا بەو جۆرە پەروەردگار مۆر ئەنێ بەسەر دڵی هەموو خۆ بە زل زانێکی زۆرداردا ۞ فیرعەون وتی ئەی هامان کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە بەڵکوو بگەمە ئەو ڕێگایانە ۞ کە ڕێگاکانی بەرزبوونەوەن بۆ ئاسمانەکان بۆ ئەوەی لەوێوە سەیری خواکەی موسا بکەم، وە بەڕاستی من وا گومان ئەبەم ئەو موسا درۆزنە

(٢٥) غافر : ٣٥ بۆ ٣٨.

﴿پەنا بە اللَّهُ﴾، ئا بەو جۆرە کردەوەی خراپ و کوفر ڕازێنرایەوە بۆ فیرعەون، وە بە هۆیەوە بەرگری کرا لە ڕێگەی ڕاست و حەق، وە هەر فێڵ و پیلانێکی فیرعەون کە هەبوو بە فیڕۆ چوو ﷺ وە ئەو پیاوەی باوەڕی بە موسا هێنابوو وتی: ئەی گەلەکەم شوێن من بکەون ڕێگای ڕاستتان نیشان ئەدەم﴾.

## دووەم: فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

١) ئەو ئیماندارە، ئازادی بکە:

لە معاویەی کوڕی حەکەمی سولەمیەوە (رضي الله عنه)، کە ئەڵێ: کە جارییەیەکم هەبوو کۆمەڵێک مەڕومالاتی منی خزمەت ئەکرد لە لای ئوحود و جەوانییە[٢٦]، ڕۆژێک سەیرم کرد بینیم سەگێکی کێوی یەکێک لە مەڕەکانی بردووە، منیش یەکێکم لە نەوەکانی ئادەم، بەوە توڕە ئەبم کە توڕە ئەبن (نەوەکانی ئادەم)، بەڵام من دانەیەکم پێدا کێشا[٢٧]، کاتێک هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو شتەی زۆر لا گەورە کردم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا ئازادی بکەم؟، فەرمووی: (بیهێنە بۆ ئێرە)، ئیتر منیش هێنام، پێ فەرموو: (أَللَّهُ (سبحانه وتعالى) لەکوێیە؟)، وتی: (لە ئاسمانە)، پێی فەرموو: (من کێم؟)، وتی: (تۆ پێغەمبەری خوایت (ﷺ))، فەرمووی: (ئازادی بکە، ئەو ئیماندارە)[٢٨].

٢) ئەو ئاسمانەی أَللَّهُ (سبحانه وتعالى)ی لێیە:

لە ئەبوو هورەیرەوە (رضي الله عنه)، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (مردوو فریشتەکان دێنە لای، ئەگەر کەسەکە صالح بێت، ئەڵێن: (وەرە دەرەوە ئەی نەفسی پاک، لە لاشەیەکی پاکدابوو، وەرە دەرەوە بە ستایشکراوی، مژدەتان لێبێت بە حەسانەوە و بۆنێکی خۆش، وە پەروەدگارێک کە توورە نییە (لێتان))، هەر بەردەوام ئەبن لە پێوتنی ئەمە هەتا دێتە دەرەوە (ڕۆحەکە)، دوای ئەوە بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان، ئاسمانەکانی بۆدەکرێتەوە، دەوترێ: (ئەمە کێیە؟)، ئەڵێن: (فلان کەسە)، ئەوترێت: (بەخێربێیت ئەی نەفسی پاک، لە لاشەیەکی پاکدابوو، بڕۆرە ژوورەوە بە ستایشکراوی، مژدەتان لێبێت بە حەسانەوە و بۆنێکی خۆش، وە پەروەدگارێک کە تۆڕە نییە

---

(٢٦) ناوچەیەکە لە باکوری مەدینە.

(٢٧) واتە: کێشای بە جارییەیەکە.

(٢٨) موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە [صحیح مسلم : ٥٣٧]، وە إبن قدامة ڕیوایەتی کردووە لە [إثبات صفة العلو] دوای ئەوەی ئەڵێ: (هێنانی هەندێک لە فەرمووده ڕوون و ئاشکراکان دەربارەی ئەوەی کە أَللَّهُ (سبحانه وتعالى) لەسەرەوەی ئاسمانە)، وە ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە صەحیحەکەیدا و مالیک ڕیوایەتی کردووە لە مووەطەئەکەیدا و أبي داود و نەسسائی و أبي داودی طەیالسی ڕیوایەتیان کردووە.

(لێتان))، هەر بەردەوام ئەبن لە پێ وتنی ئەمە هەتا دەگەیەندرێتە ئەو ئاسمانەی ﷲ (ﷻ)ی لێیە)[٢٩].

٣) ئەوەی لە ئاسمانە ڕەحمتان پێدەکات:
لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە (ﷺ)، ئەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت: (بەزەیکاران ﷲی ڕەحمان ڕەحمیان پێدەکات، ڕەحم بنوێنن بەوەی لە زەوییە ڕەحمتان پێدەکات ئەوەی لە ئاسمانە)، ڕەحم پارچەیەکە لە ڕەحمان، ئەوەی بەجێی بگەیەنێت ﷲ (ﷻ)ش ڕەحمی پێدەگەیەنێت، ئەوەشی بیپچڕێنێت ﷲ (ﷻ)ش دەیپچڕێنێت)[٣٠].

٤) متمانەپێکراوی ئەوم کە لە ئاسمانە:
لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە (ﷺ)، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا ئێوە متمانە بە من ناکەن لە کاتێکدا متمانە پێکراوی ئەوەم لە ئاسمانە، هەواڵەکانی ئاسمانم بۆ دێت لە بەیانیان و ئێواران)[٣١].

٥) لەلای خۆیەتی لەسەروو عەرشەوە:

---

(٢٩) ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە [المسند : ٨٧٦٩ ، ٢٥٠٩٠]، وە ئیبن ماجە لە [سنن إبن ماجە : ٤٢٦٢]، وە ذەهەبی لە [الأربعين في صفات رب العالمين : ٢٤]، وە ئەڵێت: (ئەم حەدیثە صەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم، بەڵام نەیان هێناوە، وتم: بوصەیریش لە [الزوائد]دا بە صەحیحی داناوە، وە [مصباح الزجاجة، بەشی: ٤، لاپەرە: ٢٥٠]دا، وە ئیبن قودامەی مەقدسی ڕیوایەتی کردووە لە [إثبات صفة العلو]دا، لە دوای وتنی: (هێنانی هەندێک لە فەرموودە ڕوون و ئاشکراکان دەربارەی ئەوەی ﷲ (ﷻ) لە ئاسمانە).
(٣٠) ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە [سنن أبي داود : ٥٠٣٨]، وە تورمذی لە [جامع : ١٩٢٤]دا، وە ئەڵێ: (فەرموودەیەکی حەسەن و صەحیحە)، وە حاکم ڕیوایەتی کردووە لە [المستدرک : ٧٦٣١]دا، وە ئەڵێ: (ئەمە فەرموودەیەکە سەنەدەکەی صەحیحە وە نەیان هێناوە (واتە: بوخاری و موسلیم)، وە ذەهەبی تێبینی داوە و وتوویەتی: (صەحیحە)، وە بەیهەقی لە [الأسماء و الصفات : ٨٩٣]دا لە دەروازەی (فەرموودەی ﷲ (ﷻ) کە ئەفەرموێت: (أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ))، وە ئیبن قودامەی مەقدسی ڕیوایەتی کردووە لە [إثبات صفة العلو]دا، لە دوای وتنی: (هێنانی هەندێک لە فەرموودە ڕوون و ئاشکراکان لەسەرئەوەی ﷲ (ﷻ) لە ئاسمانە).
(٣١) بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە [صحيح البخاري : ٤٣٥١]دا، وە موسلیمیش لە [صحيح مسلم : ١٠٦٤]دا.

لە ئەبو هورەیرەوە (ﷺ)، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کاتێک اللَّهُ (ﷻ) خەلقی تەواو کرد، لە لای خۆی لە سەرووی عەرشەوە نوسی: (ڕەحمەتم زاڵبوو بەسەر توڕەبووونمدا)[٣٢].

٦) نزیکبوویەوە لە اللَّهُی الجبار پەروەردگاری خاوەن شکۆ:

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ﷺ): ئەو شەوەی شەوڕەوی بە پێغەمبەری خوا کرا (ﷺ).. دوای ئەوە بەرزکرایەوە لەسەروو ئەوەوە بەوەی کەس نایزانێت جگە لە اللَّهُ، تا گەیشتە شوێنێک کە پێی ئەوترێ (سدره المنتهى) وە الجبار نزیکبوویەوە، کە پەروەردگاری خاوەن شکۆیە، نزیک بوویەوە تا بە ئەندازەی دوو کەوان یان کەمتری مابوو، ئیتر اللَّهُ (ﷻ) وەحیی بۆ کرد بەوەی کە وەحیی بۆ کرد: پەنجا نوێژ لەسەر ئومەتەکەت لە هەموو ڕۆژ و شەوێکدا فەرزە)[٣٣].

٧) پەروەدگارمان لەکوێ بووە پێش بەدیهێنانی بەدیهێنراوان؟:

لە ئەبی ڕەزینەوە (ﷺ)، ئەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پەروەردگارمان لە کوێ بووە پێش دروستکردنی دروستکراوەکان؟، فەرمووی: (لە هەوادا بووە، سەرەوە و خوارەوەی هەوا (واتە بەتاڵ) بووە، هیچی لەگەڵ نەبووە، لە پاشاندا عەرشی خۆی دروستکردووە و لەسەر ئاو دایناوە)[٣٤].

---

(٣٢) بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە [صحيح البخاري : ٣١٩٤]، وە موسلیمیش لە [صحيح مسلم : ٢٧٥١].

(٣٣) بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە [صحيح البخاري : ٧٥١٧].

(٣٤) ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە [المسند : ١٦١٨٨]، وە تورمذی لە [جامع : ٣١٠٩]، وە دەربارەی ئەڵێ: (ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنە)، وە إبن ماجه لە [سنن إبن ماجه : ١٨٢]، وە عبداللەی کوڕی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە [السنة : ٤٥٠]، وە إبن حبان لە [صحيح إبن حبان : ٦١٤٠]، وە دارەقوطنی لە [الصفات : ٥٧] ڕیوایەتی کردووە ە ئەڵێ: محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە، ئەڵێ: العباس بن محمد الدوري بۆی گێڕاینەوە، ئەڵێ: گوێم لە أبا عبيد القاسم بن سلام بوو، کە باسی ئەو دەروازەیەی ئەکرد، کە بینینی اللَّهُ و کورسی و شوێنی دوو پییەکەی اللَّهُی تێدا ڕیوایەتکراوە، وە پێکەنینی پەروەردگارمان بە بێ ئومێدی بەندەکانی و نزیکی جگە ئەوە، وە پەروەردگارمان لە کوێ بوو پێش دروستکردنی ئاسمان، وە دۆزەخ پڕنابێت تاکوو پەروەردگارمان پێی پیرۆزی تێنەخات، دۆزەخیش ئەڵێت: بەسمە بەسمە، وە نموونەی ئەم =

= فەرموودانەش، (دارەقوطنی) ئەڵێ: ئەم فەرموودانە صەحیحن، فەرموودەناسان و فەقیهەکان هەندێکیان لە هەندێکیانەوە وەریانگرتووە، ئەمە لای ئێمە حەققە و شکی تێدا نییە، بەڵام گەر بوترێ پەروەردگار چۆن پێی دائەنێت و چۆن پێئەکەنێت؟، ئەڵێین ئەمە ڕاڤە ناکرێت و گوێمان لە کەس نەبووە تەفسیری کردبێت.

وتم (نوسەر): سەنەدەکە تا القاسم بن سالم صەحیحە، وە ئەو ئیمامێکی گەورەیە، لە ٢٢٤ی کۆچیی وەفاتی کردووە، وە دەربارەی ئەمە بەسە بۆت کە إسحاق بن راهویە ئەڵێ: (الله شەرم لە حەق ناکات، باسکی عوبەید لە من زاناترە، وە لە کوڕەکەی حەنبەل (واتە ئیمام ئەحمەد) و شافعیش زاناترە) [(تأريخ بغداد، بە: ١٤، لا: ٣٩٢) و (طبقات النحويين لأبي بكر الإشبيلي، لا: ١٩٩)]، جا گەر ئەم فەرموودەیە صەحیح بێت لای سەلەف، وە گومانیان نەبووبێ تێیدا، ئەوە ئێمە بۆمان نییە پێچەوانەی ئەوان بکەین.

حەڕبی کرمانی (٢٨٠ ک.) ئەڵێ: إسحاق بن راهویە ئەڵێ: لە فەرموودەی ئەبی ڕەزینی عوقەیلی: وتەی: (لە هەوادا بووە، سەرەوە و خوارەوەی هەوا (واتە بەتاڵ) بووە، هیچی لەگەڵ نەبووە)، ئەمە بە واتای ئەوە دێت کە: الله (ﷻ) لە هەوادا بووە پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوییەکان (٧ زەوییەکە) دروستبکات، وە ڕاڤەی ئەمە لای ئەهلی عیلم و زانایان، بڕگەی: (لە هەوادا بووە)، واتە: (لە هەوردا بووە) [مسائل حرب، لا: ٤١٤].

## سێیەم: وتەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە لە خانەوادەکەشی

١) ئەبی بەکری صدیق (رضي الله عنه):

لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) ئەڵێ: (کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، ئەبو بەکر (رضي الله عنه) چووە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هاتە سەری و نێوچاوانی ماچکرد، وە وتی: (بە باوک و دایکمەوە ببم بە قوربانت، هەر شیرینیت بە زیندوویی و مردووی)، وە وتی: (هەرکەسێک موحەممەدی ئەپەرست ئەوە موحەممەد مردووە، ئەوەشی اللّٰه ئەپەرستێ اللّٰه لە ئاسمانە، زیندووە و نامرێ))[٣٥].

٢) عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه):

سالمی کوڕی عەبدوالله ئەڵێ: (کەعبی ئەحبار بە عومەری وت: (بەدبەختی بۆ دەسەڵاتداری زەوی لە دەسەڵاتداری ئاسمان)، عومەر وتی: (مەگەر کەسێ نەبێ لێپێچینەوە لەگەڵ خۆی دەکات)، کەعب وتی: (مەگەر کەسێ نەبێ لێپێچینەوە لەگەڵ خۆی بکات)، عومەر الله اکبر ی کردوو و سەجدەی برد )[٣٦].

٣) عائیشە دایکی باوەڕداران (اللّٰه لێی ڕازیبێت):

عائیشە (اللّٰه لێی ڕازیبێت) ئەڵێ: (سوێند بە اللّٰه، ئەترسم کە حەزم بە کوشتنی هەبووبێت، ئەمکوشت [مەبەستی عوثمانە]، بەڵام اللّٰه لەسەر عەرشەوە زانایە کە من حەزم بە کوشتنی نەبووە)[٣٧].

٤) زەینەبی دایکی باوەڕداران (اللّٰه لێی ڕازیبێت):

(٣٥) بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە [تأريخ الكبير : ٦٢٣]، وە ذەهەبیش لە [العرش : ١٠١]دا ئەڵێ: داریمی هێناویەتی بە سەنەدێکی صەحیح.

(٣٦) داریمی ڕیوایەتی کردووە لە [الرد على الجهمية : ٤١]، وە خەرائیطی لە [فضيلة الشكر : ٦٧]، وە فەرموودەیەکی صەحیحە، شاهیدیش لە ئەثەرەکە ئەوەیە کە عومەر (رضي الله عنه) دانینا بە قسەکەی کەعبی ئەحبار، بەوەی اللّٰه (عز وجل) لەسەر عەرشە.

(٣٧) داریمی ڕیوایەتی کردووە لە [الرد على الجهمية : ٣٥]، بە سەنەدێکی صەحیح.

له ئەنەسەوە، وتی: (کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی لەسەر زەینەبی کچی جەحش (فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا)، وتی: (ئەو شانازی بەسەر خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ئەکرد (ﷺ) بەوەی ئەیوت: (خانەوادەکانتان ئێوەی بەشوو داوە، بەڵام من ﷲ (ﷻ) لەسەروو حەوت ئاسمانەوە بەشویدام).

٥) ئیبن عەباس (رضي الله عنه):

له ذەکوانەوە، ئازادکراوی دایە عائیشەیە: ئیزنی وەرگرت لە عائیشە کە لەسەرەمەرگدابوو تاکوو ئیبن عەباس (رضي الله عنه) بێتە ژوورەوە بۆ لای، وە لەلای ئەو کورەزاکەی لێبوو، کە ناوی عبداللەی کوڕی عبدالرحمان ە... ئیبن عەباس (رضي الله عنه) وتی: (تۆ خۆشەویسترین خێزانی پێغەمبەری خوا بوویت (ﷺ)، ئەو هیچ شتێکی خۆشنەئەویست ئیللا ئەو شتە نەبێت کە پاکە، وە ﷲ (ﷻ) پاکی تۆی لە سەروو ئاسمانەوە دابەزاند)[٣٨].

وە ئیبن عەباس (رضي الله عنه) ئەڵێ: (کاتێک ﷲ (ﷻ) قسەی لەگەڵ موسادا کرد، دەنگەکە لە ئاسمانەوە بوو، وە ﷲش لە ئاسماندا بوو)[٣٩].

٦) عبداللەی کوڕی مەسعود (رضي الله عنه):

ئەڵێ: (لە نێوان ئاسمانی دونیا و ئەوەی بەدوایدا دێت پێنج سەد ساڵ ڕێیە، وە لە نێوان هەردوو ئاسمانێکدا پێنج سەد ساڵ ڕێیە، وە لە نێوان ئاسمانی حەوتەم و کورسی پێنج سەد ساڵ ڕێیە، وە لە نێوان کورسی و

(٣٨) ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە [المسند : ٣٣٦٢]دا، وە لێکۆڵەرەوانی موسنەدی ئیمام ئەحمەد کە سەرپەرشتیارەکەیان (شوعەیب) ئەرنەئوطە ئەڵێ: سەنەدەکەی بەهێزە ە لەسەر مەرجی موسلیمە، پیاوەکانی سەنەدەکەی پیاوانی دوو شێخەکەن (بوخاری و موسلیم)، جگە لە إبن خثيم - کە ناوی: عبداللەی کوڕی عوثمانی کوڕی خثيم ە- کە لە پیاوانی سەنەدی موسلیمە. وە داریمی ڕیوایەتی کردووە لە [الرد على الجهمية : ٣٩]دا، وە إبن حبان لە [صحيح إبن حبان : ٧١٠٨]دا.

(٣٩) [خلق أفعال العباد للبخاري : ٤٠]، وە الحنائي ڕیوایەتی کردووە لە [الفوائد : ٣٠٠]دا.

ئاودا پێنج سەد ساڵ ڕێیە، وە عەرش لەسەر ئاوە، وە الله (ﷻ) لە سەروو عەرشەوەیە، وە ئەزانێت ئێوە لەسەر چین)[٤٠].

(٤٠) داریمی ڕیوایەتی کردووە لە [الرد على الجهمية : ٨١]دا، وە طەبەڕانی لە [معجم الكبير : ٨٩٨٦]دا و بەیهەقی لە [الأسماء الصفات : ٨٥١]دا و لالەکائی لە [أصول الإعتقاد : ٦٥٩]دا، هەموویان لە ڕێگەی عاصم لە زەڕەوە، کە دەرەجەکەی حەسەن

وە ذەهەبی لە [العلو : ١٧٣]دا ئەڵێ: (عبداللەی کوڕی ئیمام ئەحمەد لە [السنة]دا ڕیوایەتی کردووە لە أبو بكر بن المنذر و أبو أحمد العسال و أبو القاسم الطبراني و أبو الشيخ و أبو القاسم اللالكائي و أبو عمر الطلمنكي و أبو بكر البيهقي و أبو عمر بن عبدالبر لە نوسراوەکانیانەوە بە سەنەدێکی صەحیح.

## چوارەم: کۆدەنگی زانایان

١) سەعیدی کوڕی عامری ضەبعی (٢١٠ ک.) ئەڵێ: (قسەی جەهمییەکان زۆر خراپترە لە قسەی جوولەکە و گاورەکان، جوولەکە و گاور و ئەهلی دینەکان کۆدەنگن لەسەرەوەی اللّٰه (ﷻ) لەسەر عەرشە، ئەوان ئەڵێن (واتە جەهمییەکان): (لەسەر عەرش هیچ شتێکی لێ نییە)[41].

٢) ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە (٢٣٨ ک.) ئەڵێ: (اللّٰه (ﷻ) ئەفەرمووێت: (ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ)[42]، کۆدەنگی ئەهلی عیلم لەسەر ئەوەیە بڵندبۆتەوە بۆ سەر عەرش، وە هەموو شتێکیش دەزانێت لە خوارووی زەوی حەوتەم)[43].

٣) قوتەیبەی کوڕی سەعید (٢٤٠ ک.)، أبو العباس السراج ئەڵێ: (گوێم لە قوتەیبەی کوڕی سەعید بوو ئەیوت: (ئەمە قسەی پێشەوایانە لە ئیسلام و ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە پەروەردگاری خۆمان بەوە ئەناسین کە لە ئاسمانی حەوتەمە لەسەر عەرش، وەکوو چۆن اللّٰه (ﷻ) ئەفەرموویێ: (ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ)[44].

٤) ئەبو زورعەی ڕازی (٢٦٤ ک.):

٥) وە ئەبو حاتەمی ڕازی (٢٧٧ ک.): عبدالرحمن ی کوڕی ئەبو حاتەمی ڕازی ئەڵێ: (پرسیارم کرد لە باوکم و ئەبو زورعەی ڕازی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننەت لە بنەماکانی دین لەو زانایانەی پێی گەیشتوون لە ناوچە جیاوازەکان لەو بیروباوەڕەی کە هەیانبووە، وتیان: (گەیشتووین بە ئەهلی

---

(٤١) خلق أفعال العباد، لا: ٣٠.
(٤٢) طه : ٥.
(٤٣) العلو للعلي الغفار في إيضاح صحيح الأخبار وسقيمها، ژ: ٤٨٧.
ذەهەبی ڕیوایەتی کردووە و ئەڵێ: (گوێبگرە بفەوتێیت گوێبگرە بۆ ئەم ئیمامە کە چۆن کۆدەنگ نقڵ ئەکات دەربارەی ئەم بابەتە، هەروەک قوتەیبە لە سەردەمی خۆیدا نقڵی کردووە).
(٤٤) ذەهەبی لە [العلو، ژ: ٤٧٠]دا باسیکردووە، وە ئەڵێ: (ئەمە قوتەیبەیە لە ئیمامەت و ڕاستگۆییدا، کە کۆدەنگی ئەگوازێتەوە دەربارەی ئەم بابەتە، کە بێگومان گەشتووە بە مالیک و لەیث و حەممادی کوڕی زەید و زانا گەورەکان وە تەمەنێکی زۆر ژیا و زانا و حافیظانێکی زۆر هاتنە بەردەم دەرگاکەی بۆ وەرگرتنی زانست.

عیلم لە هەموو ناوچەکان، لەوانە: حیجاز و عێراق و میسڕ و شام و یەمەن، لەو ڕێباز و بیروباوەڕەی هەیانبووە، بریتییە لە:

١) ئیمان گوفتار و کردارە، وە زیاد و کەم ئەکات.

٢) وە ﷲ (ﷻ) لەسەر عەرشە و جیایە لە دروستکراوەکانی، وەکوو چۆن خۆی وەسفی خۆیی کردووە لە پەڕاوەکەیدا، وە لەسەر زمانی نێردراوەکەی (ﷺ) بێ چۆنێتی بۆدانان، وە زانستەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾[٤٥].

٦) ئیبنو قوتەیبەی دینەوەری (٢٧٦ ک.) ئەڵێ: (ئەگەر بێتو ئەوانە بگەڕێنەوە بۆ سروشتی خۆیان و ئەوەی لەسەری بوون لە سروشتی خۆیان لە ناسینی دروستکار (ﷻ)، ئەوا ئەزانن کە ﷲ (ﷻ) بەرزە و لەشوێنێکی بەرزدایە وە دڵەکان لەکاتی یادکردندا ناوی بەو شێوە دەهێنن وە دەستەکان بەرزدەکرێنەوە بۆ لای لە کاتی پاڕانەوەدا، وە لە بەرزییەوە ئاسودەیی ئەدات و سەرکەوتن ئەبەخشێت و ڕزق دائەبەزێنێت، وە لەوێ کورسی و عەرش و پەردە و فریشتەکانی لێیە، هەموو ئوممەتەکان - عەرەب و ئەعجەمی - ئەڵێن: ﷲ (ﷻ) لە ئاسمانە وەک چۆن دایناوە لە سروشتدا و بە زانست ئەمە نەگواستراوەتەوە)[٤٦].

٧) عوسمانی کوڕی سەعیدی داریمی (٢٨٠ ک.) ئەڵێ: (وشەیەک هەیە کە موسڵمانان و کافران لەسەری کۆکن، ئەویش ئەوەیە کە ﷲ (ﷻ) لە ئاسمانە، یەکیان گرتووە لەوەدا جگە لە مەریسی گومڕا و هاوڕێیانی، تەنانەت ئەو منداڵانەی نەگەشتوون بە بلوغ و باڵغ نەبوون ئەوە دەزانن، منداڵ کاتێک کارەساتێکی بەسەردادێ دەستەکانی بەرز ئەکاتەوە بۆ خوای خۆی داوای لێ ئەکات لە ئاسمان، هەموو کەسێک شارەزاترن بە ﷲ (ﷻ) و شوێنەکەی لە جەهمییەکان).

وە ئەڵێ: (موسڵمانان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی ﷲ (ﷻ) لەسەر عەرشە لەسەروو ئاسمانەکانەوە)[٤٧].

وە ئەڵێ: (ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هاتوون، وە لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و دوای ئەوانیش زۆرترە لەوەی لەم پەرتووکەماندا بیانژمێرین، جگە لەوەی ئێمە کورتمان کردۆتەوە لەوەی عاقڵەکان بەڵگەی

(٤٥) شرح أصول إعتقاد أهل السنة الجماعة، ژ: ٣٢١.

(٤٦) تأويل مختلف الحديث، لا: ٣٩٤ بۆ ٣٩٥.

(٤٧) نقض الإمام أبي سعيد عثمان بن سعيد على المريسي الجهمي العنيد، لا: ٧٨.

پێ دەهێننەوە کە ئوممەت هەمووی و ئوممەتانی پێشووش گومانیان نەبووە لە زانینی ئەوەی ﷲ لەسەروو ئاسمانەکانەوەیە، جیایە لە دروستکراوەکانی، جگە لە کۆمەڵێک لادەر لە ڕێی حەق، پێچەوانەکاری قورئان و ئاثاری هەموو زانست)[٤٨].

٨) حەربی کرمانی (٢٨٠ ک.) ئەڵێ: (ئەمە ڕێبازی پێشەوایانی زانست و هاوەڵانی ئەثەر و ئەهلی سوننەتی ناسراوان بەوەی چاویان لێ کراوە، وە گەشتم بەوانەی پێیان گەشتووم لە زانایانی ناوچەی عێراق و حیجاز و شام و جگە لەوانیش، ئەوەی لە شتێکدا پێچەوانەی ئەم ڕێبازە بێت یان تانەی لێ بدات یان وتەبێژەکەی عەیبدار بکات، ئەوە موبتەدیع و دەرچووە لە کۆمەڵی موسڵمانان، لاچووە لە ڕێبازی سوننەت و ڕێگای حەق، ئەوە ڕێبازی (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مەخلەد و عبداللەی کوڕی زوبێری حومەیدی و سەعیدی کوڕی مەنصور و جگە لەوانیش)، کە دانیشتووین لایان و زانستمان وەرگرتوون، لە وتەکانیان بریتییە لە: ئیمان وتە و کردار و ویست و دەستگرتنە بە سوننەت.. ﷲ (ﷻ) لەسەر عەرشە، وە کورسی شوێن پێیەتی، وە ئەو ئەزانێت چی لە حەوت ئاسمانەکەدایە، وە ئەزانێت چی لە حەوت زەوییەکەدایە، وە چی لە نێوانیان و ژێریان و ژێر خاکدایە، لەبەرەوەی ﷲ (ﷻ) لەسەر عەرشە لە سەرووی ئاسمانی حەوتەمەوە، وە هەموو شتێک ئەزانێت، وە جیایە لە دروستکراوەکانی، هیچ شوێنێک نییە بەتاڵ بێت لە زانستەکەی، ﷲ (ﷻ) عەرشی هەیە وە عەرش هەڵگری هەیە کە هەڵی ئەگرن، وە سنووری هەیە و بەس خۆشی شارەزایە پێی و کەس نایزانێت کە چییە)[٤٩].

٩) زەکەریای ساجی (٣٠٧ ک.) ئەڵێت: (وتە لە سوننەت لەوەی هاوەڵانمان بریتییە لەوەی ﷲ (ﷻ) لەسەر عەرشەکەیەتی نزیک دەبێتەوە لە دروستکراوانی هەرچۆن خۆی ویستی لێبێ)[٥٠].

(٤٨) الرد على الجهمية، لا: ٦٧.

(٤٩) مسائل الحرب الكرماني، لا: ٩٧٣.

(٥٠) إبن الوزير نقڵی کردووە لە [العواصم والقواصم في الذب عن سنة أبي القاسم، بە: ٣، لا: ٤٣١]. ذەهەبی لە [العلو، ژ: ٥٢٤]دا ئەڵێ: (ساجی شێخی و حافیظی بەصرە بووە، وە ئەبولحوسەنی ئەشعەری لەوەوە فەرموودە و وتەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتی وەرگرتووە.

١٠) محمدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی خوزەیمە (٣١١ ک.) ئەڵێت: (اَللَّهُ (ﷻ) لە ئاسمانە وەک چۆن هەواڵی پێداوین لە ڕاوەستاوەکەی کە دایبەزاندووە (کە قورئانە) و لەسەر زمانی نێردراوەکەی، وەک چۆن لە تێگەشتنی موسڵمانانە، لە زانا و نەزانان، ئازاد و پاشاکان، نێر و مێیەکان، پێگەشتوو و منداڵان، هەموویان کاتێک ئەپاڕێنەوە لە اَللَّهُ (ﷻ) سەریان بەرز ئەکەنەوە بۆ ئاسمان و دەستەکانیان ڕوو ئەکەنە اَللَّهُ (ﷻ)، بۆ بەرزترین، نەک نزمترین)[٥١].

وە ئەڵێ: (هەرکەس دان نەنێت بەوەی اَللَّهُ (ﷻ) لەسەر عەرشەکەیەتی، وە بەرز نەبۆتەوە بۆ سەرووی حەوت ئاسمانەکە، ئەوە کافرە بە اَللَّهُ (ﷻ)، داوای تەوبەی لێ ئەکرێت، یان تەوبە ئەکات یان ئەدرێت لە گەردنی، وە فڕێ ئەدرێتە زبڵدانەکان بۆ ئەوەی موسڵمانان و پەیمان لێوەرگیراوان[٥٢] بە بۆنەکەی بێزار نەبن، وە ماڵەکەی فەیئە و هیچ موسڵمانێک میراتی لێ نابات، موسڵمان میرات لە کافر نابات، وەک پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموویت)[٥٣].

١١) ئەبولحەسەنی ئەشعەری (٣٢٤ ک.) ئەڵێ: (دەروازەیەک دەربارەی ئەوەی پێشینان لەسەری کۆکبوون لە بنچینەکان، کە بەڵگەی لەسەرهاتووە و فەرمانی پێکراوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کە اَللَّهُ (ﷻ) لەسەروو ئاسمانەکانەوەیە لەسەر عەرش دوور لە زەوی، لەسەر ئەوەش بەڵگەی هێناوەتەوە: (ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ)[٥٤]، وە (إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ)[٥٥]، وە (ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ)[٥٦]، وە بڵندبوونەوەکەی بۆ سەر عەرش دەستبەسەرداگرتن نییە، وەک ئەهلی قەدەر ئەیلێن، لەبەرەوەی اَللَّهُ (ﷻ) بەردەوام دەستی بەرداگرتووە، وە ئەویشە نهێنی و شاراوەتر لە نهێنی دەزانێت، هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە لە ئاسمانەکان

(٥١) كتاب التوحيد وإثبات صفات الرب عز وجل، بە: ١، لا: ٢٥٤.
(٥٢) واتە: ئەوانەی پەیمانیان لێوەرگیراوە لە گاور و جوولەکە و مەجووس، کە لە وڵاتی موسڵمانان بژین.
(٥٣) حاکم ڕیواتی کردووە بە سەنەدێکی صەحیح.
معرفة علوم الحديث، لا: ٨٤.
(٥٤) الملک : ١٦.
(٥٥) فاطر : ١٠.
(٥٦) طه : ٥.

و زەوی، تەنانەت وەک ئەوەی ئامادەبێت لەگەڵ هەموو شتێکدا، وە بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ ئەمە: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾[٥٧]، واتە: (وە ئەو لەگەڵتانە لە هەرکوێیەکبن)، ئەهلی عیلم بەوە لێکیان داوەتەوە کە زانستەکەی دەوری داون هەرچۆنێک بن، وە الله کورسی هەیە جگە عەرشەکەی، وە بەڵگەی هێناوەتەوە: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾[٥٨]، وە فەرموودە هاتوون لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە ٱللَّهُ (ﷻ) کورسیەکەی دادەنا ڕۆژی قیامەت بۆ جیاکردنەوەی دادوەری لەنێوان درووستکراوەکانی)[٥٩].

وە ئەڵێ: (ئوممەت کۆدەنگن لەسەرئەوەی ٱللَّهُ (ﷻ) عیسای بەرزکردۆتەوە بۆ ئاسمان، وە لە دوعاکانی ئەهلی ئیسلام کاتێک ئومێدیان هەیە بە ٱللَّهُ لە کارێکدا بۆیان بکات هەموویان پێکەوە ئەڵێن: (ئەی نێشتەجێی ئاسمان)، وە هەموویان سوێند ئەخۆن ئەڵێن: (نا سوێند بەوەی داپۆشەری حەوت ئاسمانەکەیە))[٦٠].

١٢) ئیبنو ئەبی زەیدی قەیرەوانی (٣٨٦ ک.) ئەڵێ: (جا لەوەی ئوممەت کۆدەنگن لەسەری لە بابەتە دینییەکان، بریتییە لەو سوننەتانەی کە پێچەوانەکەی بیدعەو گومڕاییە ئەوەیە: ٱللَّهُ ناوی هەیە لە ناوە جوانەکان و سیفەتە بەرزەکان، لەسەروو ئاسمانەکانەوەیە لەسەر عەرشەکەی نەک زەوی، وە زانستەکەی لە هەموو شوێنێکە، وە ٱللَّهُ کورسی هەیە، وەک ئەفەرموێت: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾[٦١])[٦٢].

١٣) ئیبنو بەطەی عوکبوری (٣٨٧ ک.) ئەڵێ: (موسڵمانان کۆدەنگن لە چینی هاوەڵان و شوێنکەوتووان، وە هەموو ئەهلی عیلمیش لە ئیمانداران کە ٱللَّهُ لەسەر عەرشە لە سەروو ئاسمانەکان، وە جیایە لە درووستکراوەکانی، وە زانستەکەی دەوری هەموو درووستکراوەکانی داوە، کەس پشتی لێ هەڵناکات و نکۆڵی لێ ناکات ئیللا کەسێک حلولی نەبێت، ئەوانە کەسانێکن دڵیان کرمۆڵ بووە وە شەیتان بردنی و دەری کردن لە دین، وە

(٥٧) الحديد : ٤.
(٥٨) البقرة : ٢٥٥.
(٥٩) رسالة إلى أهل الثغر بيان الأبواب، لا: ١١٧ بۆ ١٣٠.
(٦٠) الإبانة عن أصول الديانة، لا: ١١٥.
(٦١) البقرة : ٢٥٥.
(٦٢) الجامع في السنن الآداب والمغازي والتأريخ، لا: ١٠٨ بۆ ١٠٩.

ئەڵێن: زاتی اللّٰه شوێن لێی خاڵی نییە، وە ئەڵێن: ئەو لەسەر زەوییە وەک چۆن لە ئاسمانە وە بەزاتی خۆی ئاگای لەهەموو شتێکە، بەڕاستی ئەوان قورئان و سوننەت و قسەی هاوەڵان و شوێنکەوتووان و زانایانی موسڵمانانیان بەدرۆخستۆتەوە)[٦٣].

١٤) ئەبو عومەری طەلمەنکی ئەندەلوسی (٤٢٩ ک.) ئەڵێ: (موسڵمانان لە ئەهلی سوننەت کۆدەنگن لەسەر واتای وتەکەی (واتە وتەی اللّٰه (ﷻ)): ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾[٦٤]، واتە: (وە ئەو لەگەڵتانە لە هەرکوێیەکبن)، وە هاوشێوەی ئەوە لە قورئانی پیرۆز، کە ئەوە زانستی اللّٰه یە (ﷻ)، وە اللّٰه (ﷻ) بە زاتی خۆی لە سەروو عەرشەکەیەتی و بەرزبۆتەوە بۆ سەری بە هەرجۆرێک بیەوێ، وە ئەهلی سوننەت دەربارەی وتەکەی (واتە وتەی اللّٰه (ﷻ)):﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾[٦٥]، واتە: (اللّٰهی ڕەحمان بەرزبۆتەوە بۆ سەر عەرشەکەی)، بەرزبوونەوە لە اللّٰه (ﷻ) وە بۆ سەر عەرشەکەی حەقیقەتە و مەجاز[٦٦] نییە، بێگومان قەومێک لە موعتەزیلەکان و جەهمییەکان وتیان دروست نییە اللّٰه (ﷻ) ناوبنرێ بەو ناوانە لەسەر حەقیقەت و مەخلوقیش بەو ناوانە ناو بنرێ)[٦٧].

١٥) ئەبو نوعەیمی ئەصبەهانی (٤٣٠ ک.) ئەڵێ: (ڕێگامان ڕێگەی پێشینی شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت و کۆدەنگی ئوممەتە.. وە ئەو فەرموودانەی کە بەرزبوونەوەی اللّٰه (ﷻ) بۆ سەر عەرش جێگیر ئەکەن، ئەوە ئەڵێن (واتە

---

(٦٣) الإبانة الكبرى لإبن بطة، بە: ٧، لا: ١٣٦.
(٦٤) الحديد : ٤.
(٦٥) طه : ٥.
(٦٦) وشەی مەجاز لە زمان و ئەدەبی کوردیدا بە واتای (خوازە) دێت، واتە شتەکە واتا ڕاستەکەی خۆی نییە، بەڵکو بۆ واتای جیاواز بەکارهاتووە، وەکوو شاعیر ئەڵێ:
ئەو جووتە شێرە دلێرەی شەرزە　　　لەناو مێژوودا ناویان زۆر بەرزە
وشەی (شێر) لە نیوە دێڕی یەکەم بۆ جگە واتای خۆی بەکارهاتووە، بۆ واتای مرۆڤ بەکارهاتووە، واتە خواستن ڕوویداوە، خواستنیش جۆرێکی خوازەیە، کە تێیدا ئەو وشەیەی کە لێ خواوتراوە ئەبێت پەیوەندییەکی زمانی هەبێت لەگەڵ بۆ خواوتراوەکە، بۆیە ئەبینین ئەهلی بیدەع وشانێک بەکاردێنن بۆ ئەوەی تەئویلی سیفەتەکان بکەن، بەڵام بێئاگا لەوەی ئەوەی ئەوان لەسەری قسە = ئەکەن بابەتێکە و قسەکەی ئەوان کە واتای سیفەتەکان بە مەجاز و خوازە وەرەگرن بابەتێکی تر، والله أعلم (وەرگێڕ).
(٦٧) ذەهەبی لە [العلو، لا: ٥٦٦]دا باسی ئەکات.

سەلەف ئەوە ئەڵێن) بەبێ چۆنێتی بۆدانان و بەبێ وێنە بۆدانان، وە اللَّه (ﷻ) لە دەرەوەی دروستکراوەکانێتی و دروستکراوکانی لە دەرەوەی ئەون (واتە جیاوازن لەو)، وە اللَّه تێکەڵیان نابێ و ناچێتە ناویانەوە، وە ئەو بەرزبووەتەوە بۆ سەر عەرشەکەی لە ئاسمانەکەی خۆی جگە زەوییەکەی)[٦٨].

١٦) ئەبو نەصری سیجزی (٤٤٤ ک.) ئەڵێ: (پێشەواکانمان وەک سوفیانی ثەوری و مالیک و حەممادی کوڕی سەلەمە و حەممادی کوڕی زەید و سوفیانی کوڕی عویەینە و فوضەیل و ئیبنولموبارەک و ئەحمەد و ئیسحاق یەکدەنگن لەسەرئەوەی کە اللَّه (ﷻ) بە زاتی خۆی لەسەر عەرشەکەیەتی، وە زاستی اللَّه (ﷻ) لە هەموو شوێنێکە، وە ئەو دائەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، وە ئەو توڕەئەبێ و ڕازی ئەبێ وە قسە ئەکات بە هەرشێوەیەک کە بیەوێ).

وە سیجزی ئەڵێ: (وە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕەحمەتی اللَّهی لێبێ دەقی هەیە لەسەر ئەوەی کە اللَّه بە زاتی خۆی لەسەر عەرشەکەیەتی، وە زانستی اللَّه لە هەموو شوێنێکە، وە خۆی ئەوەی ڕیوایەت کردووە و جگە خۆشی ڕیوایەتیان کردووە لە عبداللەی کوڕی نافیع لە مالیکی کوڕی ئەنەس ڕەحمەتی اللَّهی لێبێ، وە بەدڵنیاییەوە جگە یەکێک لەگەڵ ابن نافع لە مالیکی کوڕی ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە، وەهەروەها متمانەپێکراوان ڕیوایەتیان کردووە لە سوفیانی کوڕی سەعیدی ثەورییەوە، وە ڕیوایەتکراوە هاوشێوەی ئەوە لە ئەوزاعی، وە ئەوانە پێشەواکانی ناوچەکانن، وە بیروباوەڕی ئەهلی حەققە کە اللَّه (ﷻ) لەسەروو عەرشێتی بە زاتی خۆی بەبێ بەرکەوتنی، وە کەڕامییەکان وە ئەوانەی شوێنکەوتەیانن دەربارەی وتەی بەرکەوتن گومڕان).

١٧) ئەبو عوسمان صابونی (٤٤٩ ک.): دەڵێ : وە ئەهلی حەدیث بڕوایان وایە و شایەتیش دەدەن کە الله پاکو بێگەردی بۆ ئەوە لەسەروو حەوت ئاسمانەکانەوە لەسەر عەرشەکەیەتی هەر وەک چۆن لە کتێبەکەیدا دەڕیبڕیووە: (إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۖ

(٦٨) ذەهەبی لە [العلو، ٥٦٩]دا ئەیگوازێتەوە لە [الإبانة للسجزي]ەوە، وە ئەڵێ: (وتم: ئەوەی کە گواستوێتییەوە لەوانەوە هەمووی ناسراو و پارێزراوە، جگە وشەی (بذاته)، واتە: بە خودی خۆی، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ زیرەکی خۆی کە پاڵی داوە بۆ ئەو پێشەوایانە، پاڵدانەکەشی بە واتایە، واتە بۆ ئەوەی عەرش جیابکرێتەوە لە جگە عەرش لەو شوێنانەکانی تر.

يُدَبِّرُ الْأَمْرَ)[٦٩]، وه له سورەتی الرعد: (اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ)[٧٠]، وه وتەکەی له سورەتی الفرقان: (الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ الرَّحْمَٰنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا)[٧١]، وه وتەکەی له سورەتی السجدة: (ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ)[٧٢]، وه وتەکەی له سورەتی طه: (الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ)[٧٣]، ئەیسەلمێنن لەوانه که الله بۆ خۆی سەلماندووه ، وه ئیمانیان پێیەتی و الله بەڕاستدادەنێن له هەواڵەکانیدا ، وه ئەوه دەردەبڕن که الله (ﷻ) دەری بڕیوه بۆ خۆی له ئیستواکردنی لەسەر عەرش، وه وەریدەگرن که چۆن هاتووه به پێی ڕووکەشەکەی وه زانستەکەی ئەدەنه پاڵ الله (ﷻ) وه ئەڵێن (آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا)[٧٤]، وەکو چۆن الله (ﷻ) دەربارەی دامەزراوان و شارەزایان لەزانیاریدا ئەوها ئەڵێن، وه الله (ﷻ) لەو کارەیان ڕازی بوو، بۆیه ستایشی کردن لەسەری)[٧٥].

١٨) ئیبنو عەبدولبەڕ (٤٦٣ ک.) ئەڵێ: (وه ئەم فەرمووده بەڵگەیه لەسەر ئەوەی که له ئاسمانه لەسەر عەرش لەسەروو حەوت ئاسمانەکانەوه، وه زانستەکەی له هەموو شوێنێکه وەکوو کۆمەڵێک له ئەهلی سوننەت و ئەهلی فیقهـ و ئەثەر)[٧٦].

١٩) قەوام السنةی ئەصبەهانی (٥٣٥ ک.) ئەڵێ: (الله ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێنا، وه عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، دوای ئەوه ئیستوای کردووه لەسەر عەرش دوای بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی، وەکوو چۆن له دەقەکاندا هاتووه، وه ئەمه واتای پێوەنوسان نییه، بەڵکو ئەو ئیستوای کردووه لەسەر عەرش بەبێ چۆنێتی بۆدانان، وەکوو چۆن دەربارەی خۆی وتویەتی.

(٦٩) یونس : ٣.
(٧٠) الرعد : ٢.
(٧١) الفرقان : ٥٩.
(٧٢) السجدة : ٤.
(٧٣) طه : ٥.
(٧٤) آل عمران : ٧.
(٧٥) عقيدة السلف أصحاب الحديث.
(٧٦) الإستذكار، بە: ٢، لا: ٥٢٧.

وە ئەوانە بانگەشەی ئەوە ئەکەن [واتە: ئیبن فەورەک و هاوەڵەکانی]: (کە نابێ ئاماژە بکرێ بۆ اللَّهُ بە سەری پەنجەکان بۆ ئاسمان، ئەوە ئەبێتە دیاری کردن).

وە هەموو موسڵمانان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ئەو بڵند و هەرە بەرزە، وە قورئانیش بەوە گوفتاری کردووە لە فەرموودەی اللَّهُدا (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى)(٧٧)، واتە: (تەسبیحاتی پەروەردگاری هەرە بڵندت بکە).

دوای ئەوە بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە: (ئەو بڵندییە بەواتای دەسەڵاتە نەک بڵندی زاتی پاکی).

وە لە لای موسڵمانان کە بڵندییەکەی بڵندی زاتی پاکێتی، وە بڵندیەتی لە هەموو جۆرە بڵندیەتەکانی تر لەبەرەوەی بڵندیەتی سیفەتی ستایشە، وە جێگربووە کە اللَّهُ بڵندیەتی هەیە بە زاتی پاکی، وە بڵندیەتی سیفەتەکانی، وە بڵندیەتی دەسەڵات

وە لە ڕێگریکردنیان لە ئاڕاستەکردن بۆ اللَّهُ (ﷻ) بەرەو ئاسمان دوبەرکییە بۆ هەموو خاوەن دینەکان، لەبەرەوەی کۆی گشتی موسڵمانان و هەموو دینیەکان ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی ئاماژە بکرێت بۆ اللَّهُ بەرەو ئاڕاستەی سەرەوە لە نزا و پاڕانەوەدا، ڕێککەوتنیان بەگشتی لەسەر ئەو بەڵگەیە، وە کەس ڕێگەینەداوە ئاماژە بکرێت بەرەو ئاڕاستەی خوارەوە یان هەر ئاڕاستەیەکی تر جگە لە سەرەوە)(٧٨).

٢٠) ئیبنو ڕوشدی حەفید (٦٠٥ ک.) ئەڵێ: (قسەکردن لە ئاراستەدا: هەرچی دەربارەی ئەم سیفەتە هەیە، هەر لەسەرەتاوە ئەهلی شەریعەت ئەیان سەلماند بۆ اللَّهُ پاک و بێگەردی بۆ ئەوە هەتا موعتەزیلە پەکیانخست، دوای ئەوەیە دواییەکانی ئەشعەریەت شوێنیان کەوتن لە پەکخستنیدا وەک ئەبی مەعالی جوەینی و ئەوانەی شوێنی کەوتن، وە ڕووکەشی شەرع سەلماندنی ئاڕاستە بە پێویستی دەکات.. لەبەرەوەی هەموو شەریعەتەکان بنیاتنراوە لەسەر ئەوەی اللَّهُ لە ئاسمانە، وە لەوێوە فریشتەکان دائەبەزن بە وەحی بۆ پێغەمبەران، وە لە ئاسمانەوە کتێبەکان دابەزیووە، وە بەرەو ئەوێوە شەوڕەوی بە پێغەمبەر کرا (ﷺ) تاکوو نزیک بویەوە لە (سدرة المنتهى)، وە

---

(٧٧) الأعلى : ١.

(٧٨) الحجة في بيان المحجة وشرح عقيدة أهل السنة، بە: ٢، لا: ١١٦ و ١١٧.

هەموو داناکان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە ﷲ و فریشتەکان لە ئاسمانن وەکوو چۆن هەموو شەریعەتەکان ڕێککەوتون لەسەری)[٧٩].

(٧٩) الكشف عن مناهج الأدلة في عقائد الملة، لا: ١٤٥.

لە کۆتاییدا ئەوە ئەڵێین کە پەروەردگارمان فەرموویەتی:

(وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا) [٨٠].

واتە: (وە هەر کەسێک دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکات پاش ئەوەی کە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوەو شوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێ بێجگە لە ڕێگەی بڕواداران ڕووی وەردەگێڕین بۆ ئەو ڕێبازەی کە هەڵی بژاردووەو دەیخەینە دۆزەخ ئای چ پاشە ڕۆژێکی خراپە).

(وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطًا) [٨١].

واتە: (بەگوێی کەسێک مەکە کە دڵیمان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردووە و شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە هەموو کارەکانی خراپ و لە سنوور دەرچووە).

(سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ۞ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۞ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ) [٨٢].

واتە: (پەروەردگارت پاک و بێگەردە پەروەردگاری باڵا دەست لەوەی بێ باوەڕان دەیڵێن دەربارەی ۞ سڵاوو درووودیش بۆ گشت پێغەمبەران ۞ سوپاس و ستایشیش بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیان).

**محمد بن شمس الدين**

---

(٨٠) النساء : ١١٥.

(٨١) الكهف : ٢٨.

(٨٢) الصافات : ١٨٠ بۆ ١٨٢.

ئەڵێین:

**وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**



لێبووینەوە لە وەرگێڕانی ئەم نامیلکەیە لە:

**٢٣ / جماد الآخرة / ١٤٤٤ بعد هجرة النبي**

**صلوات الله والسلام عليه وعلى آله وصحبه أجمعين**

**قضاء كلار / محافظة السليمانية / إقليم كردستان - العراق**



# فهرس